# توێشووی سەفەر

ڕێبوارێکی ماندو لە شەوە زەنگی فیتنە



نوسین و لێکۆڵینەوەی
لێکۆڵەر ئەبی عبداللە کوردستانی



## پێشەکی

**الحمدلله له مافي السموات ومافي الأرض وصلى الله على نبينا سيد المرسلين وخاتم النبيين محمد صلى الله عليه وسلم وعلى آل وأصحابى أما بعد...**

پێشەکییەک بۆ چوونە نێو باسەکە: بەپێویستم زانی وەک موسڵمانێک لەلایەک و، هەروەها وەک بانگخوازێک لەلایەکی ترەوە، وەک فەرموودەی رسول (بلغوا عنى ولو آية) گەر ئایەتێکت گەیاند دەبیتە گەیەنەر. هەروەها وەک کاری ئەمر بەچاکە و نەهی لە خراپە (منكر) لەلایەکی تر، وەک قَالَ اللهُ تَعَالَىٰ:﴿ كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ ﴾.

هەروەها بەتایبەت بۆ ئەم بارودۆخ و کاتەی ئێستا، چونکە بەڕاستی ئەهلی ئیمان و خەڵک لە فەراغێکی دینی و بێ عیلمی و نەمانی زانایان دان. هەروەها لەسەردەمی دەرکەوتنی بانگخوازی گومڕا و گومڕاکەر دان و داین. پێویستمان بەچرا و ڕووناککەرەوەیەک هەیە، بۆئەوەی بتوانین لەنێو شەوە زەنگی تاریکی فیتنە، ڕێگامان بۆ ڕۆشن بکاتەوە.

ئەمڕۆ ئیسلام وەک دارێک وایە، یەک قەدە بەڵام دەیان لق و پۆپی لێبووەتەوە. هەریەکە و بەلایەکدا کەوتووە و ڕۆیشتووە، پێویستە بگەڕێینەوە بۆ قەدەکەی کە ڕێگا پوخت و ڕاستیەکەیە.

چوارچێوەی بارودۆخ بە لێکۆڵینەوەی علومەکان:

١- لە قورئاندا الله دەفەرموویێت: ﴿أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ﴾. واتە قورئان و حەدیث.

٢- هەروەها لە حەدیثدا رسول الله دەفەرموویێت: **ترکت فیکم أمرین یان شیئین یان ثقلین**. ئەمانیش کتاب الله وسنة نبینا یان أهل بیت.

٣- بەپێی ئەحادیث و بارودوخ لە عیلمی أشراط ساعة، واتە زانستی نیشانەکانی قیامەت کە خۆی دەبینێتەوە لە فتن و ملاحم.

لەفەرمودەیەکدا دەفەرمووێت: پەلەبکەن لەکرداری چاک پێش هاتنی فیتنە کە وەک شەوی تاریک کە پیاو بەیانی ئیمانداره و شەوەکەی کافره یان بەپێچەوانە **(یبیع دینه بعرض من الدنیا)**[(١)]. ئەم فیتنەیە ڕوویداوە و ئێستا ئێمە لەناوی داین هێندە قوڵ و سەخت و دژوارە بەپێی ئەم فەرموودەیە، هیچ یەکێک لە ئێمە ناتوانین تەنانەت یەک ڕۆژ کەفالەت یان ضەمانی ئیمانی خۆمان بکەین لە بەیانی هەتا شەو، چەند سەختە.

---

(١) ئەمە لە صحیح مسلم واردە.

٤- هەروەها لە عیلمی جەرح و تەعدیلدا تابعی گەورە و بەڕێز محمد بن سیرین، واتە ابن سیرین دەفەرمووێت: ئێمە لەسەرەتادا گوێمان نەدەدا بە ئیسناد، واتە سەنەد. لە کویێ هەبوایە وەرمان دەگرت. بەڵام کە فیتنە سەریهەڵدا، تەنیا لەوانە نەبێت کەوا جێی متمانە (ثقة)ن وەرمان نەدەگرت[1].

سەیربکەن لەکاتی فیتنە نابێت دین لە هەموو کەس وەربگیردرێت. دواتر لەبەشەکانی داهاتوو دەچینە وردەکارییەوە.

٥- هەروەها زانایان دەفەرموون: ئەم زانستە واتە عیلم، دینە. بۆیە بزانن و وریابن بزانن کەوا دین لە کێ وەردەگرن. سەیربکەن سەلەف ووردبوونە لە وەرگرتنی عیلم.

پشتیوان بە الله دەچینە نێو ناوەڕۆکی باس و بابەتەکان، باسێکی یەکلاکەرەوە و گرنگە. بۆ یەکەم جاریش دەبێت بەم شێوەیە بێتە بەردەستت، بەکارهێنانی علومەکان بەگشتی بۆ دۆزینەوەی ڕێگای ڕاست.

**✍ نوسین و لێکۆڵینەوەی**

**أبی عبدالله کوردستانی**

---

(١) ئەم باسە لە مقدمەی صحیح مسلم واردە.

## بەشی یەکەم: ڕێگای ڕزگاربوونت

ئێمە لە ناخۆشترین سەردەم و زەمەنداین بەپێی حەدیث و ئەحایدث.
ئێمە لەگێژاوی فیتنەی زۆر قوڵ و سەختداین، بەجۆرێک زۆر کەم کەس بەئیمانداریشەوە لێی ڕزگاری دەبێت، سەختە زۆر. بۆیە پشتیوان بە الله لەسەرەتای باس تاوەکو ئەمڕۆ بۆتان شی دەکەمەوە.

قَالَ اللهُ تَعَـالَىٰ:﴿وَٱعۡتَصِمُواْ بِحَبۡلِ ٱللَّهِ جَمِيعٗا وَلَا تَفَرَّقُواْۚ ﴾. ئەمە ئایەتێکی صەریح و موحکەمە. هەروەها فەرمانە بۆ ئەهلی ئیمان کەوا دەست بگرن بە {حبل الله}.

**لە تەفسیری البغوی:**

لەبارەی ئەم وشەیە، دەڵێت: ابن عباس دەڵێت: واتە دەست بگرن بە دینی الله.

هەروەها ابن مسعودیش دەڵێت: ئەو جماعەتە، ئەو شتەیە کەوا الله فەرمانی دەست پێوەگرتنی پێکردووین.

هەروەها مجاهد و عطاء دەڵێن: {عهد الله}، واتە بەڵێن و پەیمانی الله عز وجل.

هەروەها سدی و قتادە دەڵێن: {بحبل الله} واتە قورئان.

هەروەک لە ابن مسعود بە مەرفوعی دەفەرموویت: ئەم قورئانە {حبل الله}یە و، ڕووناکی و شفای سودگەیەنەرە و، پارێزەری ئەوەشە کە دەستی پێوە دەگرێت. ڕزگارکەری ئەوەیە کەوا شوێنی دەکەوێت.

{ولاتفرقوا} هەروەها دەڵێت: یەهود و نەسارا جیابونەوە و ناکۆکی کەوتە نێوانیان، بۆیە لەناوچون. واتە هەندێکیان گومڕابوون وەک گاور و هەندێکیان غەزەبیان لێ گیرا وەک جولەکە.

**هەروەها لە تفسیری ابن کثیر:**

دەڵێت: {بحبل الله} واتە عەهد و پەیمان و بەڵێنی اللەیە، وەک ئایەتی:
﴿ضُرِبَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلذِّلَّةُ أَيۡنَ مَا ثُقِفُوٓاْ إِلَّا بِحَبۡلٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَحَبۡلٖ مِّنَ ٱلنَّاسِ﴾(١)
{حبل الله} واتە قورئان. لە ئیمامی "علی"یەوە بە مەرفوعی دەفەرموویت: {حبل الله} قورئان و ڕێگای ڕاستە.

هەروەها ئیمامی ابو جعفر لە ابو سعید و لە رسول اللهوە (ﷺ): (کتاب الله)، ئەوا پەتی توندی اللەیە لەئاسمانەوە بەرەو زەوی.

{ولاتفرقوا} بەهەمان شێوەی البغوی دەڵێت: فەرمان کردنە بەجماعەت و لێک نەبوون و ناکۆکییە. وەک هێنانی ئەم فەرموودەیە بەنمونە. لە صحیح مسلم لە ئەبو هرێرەوە الله لێی ڕازی بێتن دەفەرموویت: الله لێتان

---

(١) آل عمران: ١١٢

ڕازییە بەوەی بیپەرستن و هاوبەشی بۆ پەیدا نەکەن، هەروەها دەست بگرن بە {حبل الله} و جیا نەبن و ناکۆک نەبن.

**تفسیری قرطبی:**

هەروەها لە تەفسیری قوڕتبی ـدا بەهەمان شێوەی تەفسیری البغوی و ابن کسیر، ئەثەر و ئەقوال و هەمان فەرموودەی هێناوە. بۆ دڵنیابوون بگەڕێنەوە بۆ تەفسیری قوڕتبی سوڕەتی آل عمران ئایەتی (١٠٢).

**هەروەها لە تەفسیری ئیمامی طبریش:**

بەهەمان شێوەی تەفسیرەکانی تر چەندان ئەثەر و ئەقوالی هێناوە لە موفەسیران و لە هاوەڵان و تابعی و تابعی تابعین لەسەر {حبل الله} کەوا کتاب اللهیە یان عەهد الله. بۆ درێژ نەبوونی باسەکە دامنەناون، بەڵام دەتوانن بۆ دڵنیابوون بگەڕێنەوە سەری لەهەمان سوڕەت و ئایەت.

بۆچی ئەم ئایەتەم بۆهێنان لەیەکەم بەش و باسی ئەم زنجیرە زۆر هەستیارە؟! چونکە لەسەرەتادا پێم گوتن کەوا هەر سێ علومەکانی قورئان و حەدیث و اشراط ساعەی تێدا بەکاردەهێنم. ئەمەش بەپێی قورئان، فەرمانی اللهیە بەوەی دەست گرتووبین بە قورئان و سوننەت و فەرمانەکانی الله. کاتێک الله دەفەرموێت: دەست بگرن {بحبل الله}، لەبەرامبەری وشەی {ولاتفرقوا} هاتووە. واتا گەر دەست گرتوو نەبن، ئەوا تەفرەقە یان ناکۆکی و ئیختلافتان دەکەوێتە نێوان بەپێی واقعیش.

ئوممەتی ئیسلام دەستی نەگرت بە {حبل الله}. بۆیە ئێستا تەفرەقەی زۆر ڕوویداوە، دەیان فیرقە و گروپ و تاقم پەیدابوون. دەبێت بگەڕێینەوە بۆ {حبل الله}، بەڵام دۆزینەوەی لەئێستادا سەختە. پشتیوان بە الله ڕوونی دەکەینەوە بۆتان لە باس و زنجیرەکانی داهاتوو.

## بەشی دووەم: دروستبوونی ئیختلاف

دوای ئەوەی کە زانرا داواکاری الله ئەوەیە موسڵمان دەست بگیردرێت بە (حبل المتين) واتە قورئان و سوننەت، بەڵام ئەم شتە نەهاتەدی بۆیە ئیختلاف و فرقە و تەفرقە دروست بوو.

لەسەردەمی رسول الله لە ساڵانی کۆتایی والله اعلم ساڵی فەتح بوو، کاتێک رسول الله غەنیمەت بەش دەکات. یەکێک پێی دەڵێت: اعدل یا محمد. واتە ئەی محمد دادپەروەری بکە. لەم شتەدا رسول الله پێی دەفەرمووێت: ویحك. هاوار بۆ تۆ. گەر من عادل نەبم، کێ دادپەروەر دەبێت. ئنجا رسول الله وەسفی دەکات و، دەفەرمووێت: لە پشتی ئەودا کەسانێک دەردەچن قورئان و نوێژ و ڕۆژووتان لەچاویان هیچ نییە، بەڵام لەدین دەردەچن. واتە مەبەستی خەواریجەکانە. ئەم باسە بەچەندان لەفز و شێواز هاتووە لە صەحیح بوخاری و موسلیم.

دوای وەفاتی رسول الله، خەواریج دەرچوو کەوا خەواریج بەیەکێک لەنیشانە دەرکەوتووەکانی قیامەت دادەنرێت. وەک زانراوە عەقیدەی

خەوارج چییە و چۆنە. بەڵام بەهۆی ئەوەی سەردەمەکە سەردەمی زێڕین بوو، بۆیە کپ کران. ڕاستە فیتنەکەیان زۆر گەورە بوون، بەڵام ڕێگای فراوان بوونیان لێ گیرا.

هەروەها دوای ئەوە "عبدالله بن سبأ"ـی جولەکەی شامی مەلعون فکرەی شیعەی هێنایە کایەیەوە. بەمەش فیرقەیەکی تر دروست بوون لە زۆرینەی کتێبە مێژوویەکان ئەم باسە باسکراوە. ئەم کەسە توانی ئەم فکرە بڵاوبکاتەوە، بەجۆرێک ئیمامی "علی" پیرۆزکرا. تاوەکو کردیانە خوا پەنا بە الله. دواتر سەرانی ئەم فکرە کوژران، بەڵام ئەم فکرە لە شیعەوە هەتا ئێستا بەردەوامە. بووەتە ڕافیزە کەوا لەسەر ئیسلام حساب کراون، هەروەها زۆرینەتان شارەزایی بیروباوەڕی ڕافیزەی مەلعونن.

دوای ئەوە کۆمەڵێک فیرقە و بیری تر هاتە ئاراوە هەر لەسەردەمی (خیر القرون) یەکێکیش لەوانە، بیری (الجهمیە)یە کەوا لەلایەن "جعد بن درهم"ـەوە دروستکرا. دواتر "جهم بن صفوان" پەرەی پێدا و بڵاویکردەوە. بەڕاستی ئەم فیکرە خەڵکانێکی زۆری گومڕا کرد. هەروەها بەهۆی ئەم فکرەشەوە دەیەها زانای ئوممەت، ئازار دراون و شەهیدکراون و دەربەدەر کراون. وەک ئیمامی "نعیم بن حماد" کەوا شەهید کرا. هەروەها ئیمامی ئەحمد گیراو لێی درا. هەروەها ئیمامی

بوخاری دەربەدەر و ئاوارەکرا و، "علی بن المدینی" توشی ئەم فیتنەیە بوو، بەڵام پەشیمان بووەوە.

هەروەها فیتنە و (فرقەی القدریە)، بەڕاستی ئەمانەش هاوشان و هاوکاتی ئەم فیتنانەی سەرەوە بوون مەترسیدار و لەناوبەر و گومڕاکەربوون. ئەم فکرەیە یان فیرقەیە زۆرێک لەزانایان توش هاتن، بەڵام هەندێکیان پەشیمان بوونەوە. قەدەریە نەفی عیلمیان دەکرد، بۆیە سەلەف وەک سواری مەیدان هاتنە دەنگ و وەڵامیان دەدانەوە و تەکفیر کران و هەندێکیان تەکفیریان تەوقیف کرد بەوەی گەر بیڵێن یان (نەفی جحد عیلم) بکەن ئەوا کافرن، وەک ابو حاتم و ابو زرعە و ئیمامی ئەحمەد. هەندێک لەزانا و هاوەڵان ڕاستەوخۆ تەکفیریان کردوون. دامەزرێنەرەکەشیان کوژرا، دوای ئەوەی ئیمامی "ئەوزاعی" لەگەڵی دانیشت و دوایی ئیستتابەی پێکرد و دواتر فتوای کوشتنیدا.

ئەمانە ئەم فکرانە بوون کەوا لەسەردەمی (خیر القرون) سەریان هەڵدا فکرە و ئیختلاف و تەفرەقەکە زۆر مەترسیدار بوو. گەر بێت ئازایەتی و بوێری زانا و ئیمامەکانی سەلەف نەبوایە، ئەم دینە خۆی ڕانەدەگرت. وەک چۆن ئیمامی ئەبوبکر الله لێی ڕازی بێت، دینی ڕاگرت بە کوشتاری هەڵگەڕاوەکانی مانعی زەکات. "علی بن مدینی" دەڵێت: ئیمامی ئەحمد

لەسەر میحنەتی خەلقی قورئان، سوننەتی ڕاگرت. بەڵێ ئەوە بزانن زاناکان، زانا بوون دینفرۆش نەبوون. بەکوشتن و گرتن ساردنەبوونەوە.

دوای ئەمانە ئەهلی کەلام یان عیلمی کەلام سەریهەڵدا و پەرەی پێدرا. دواتر ئەشاعیرە سەریهەڵدا، کەوا لە بابەتی ئەسمائو سیفات تەئویلاتیان دەکرد. ئنجا قوتابخانەی فەلسەفی پەیدا بوو بەکورتی تەفرەقە و ئیختلاف ڕۆژ دوای ڕۆژ و سەدە دوای سەدە زیاد دەبوو.

ئەمە کورتەیەک بوو لە دروستبوونی ئیختلاف و تەفرەقە و کەرت بوون و هەڵگەڕانەوە و گومڕابوون لەسەردەمی سەلەف تا ئێستا دەیەها فیرقەی تر سەریهەڵداوە. هەر هەموویان وەک یەک بەحساب قورئان دەخوێنن، بەڵام لەعەقیدە لێک دوورن. بۆیە دۆزینەی حەق لەنێوان ئەم گێژاوی فیتنەیە سەختە گەربێت و شارەزا نەبیت. پشتیوان بە الله ئێمە وەک پەڕەی سپی ڕێگا ڕاستەکەتان بۆ نیشان دەکەین.

## بەشی سێیەم: ئێمە لەچی سەردەمێکداین بەپێی زانستی نیشانەکانی قیامەت؟

دوای کورتە باسێک لەسەر ئیختلاف و ناکۆکی و پشتکردن لە {حبل الله}، پێویستە بزانرێت ئێمە لە چی قۆناغێکین و چی شتێک بکەین تا ڕزگارمان بێت لە فیتنەکان، ئەمیش بە پێی (فتن و ملاحم).

**یەکەم: بەپێی زانستی نیشانەکان ئێمە لەسەردەمی بێ عیلمین، (واتە نەزانی یان لەسەردەمی جەهل داین) بەپێی ئەم فەرموودانە.**

١. أَبُو التَّيَّاحِ، حَدَّثَنِي أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): "مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ أَنْ يُرْفَعَ الْعِلْمُ، وَيَثْبُتَ الْجَهْلُ، وَيُشْرَبَ الْخَمْرُ، وَيَظْهَرَ الزِّنَى".

ئەنەسی کوڕی مالك دەڵێت: لە رسول الله دەفەرمووێت: لە نیشانەکان قیامەت بەرزبوونەوەی زانست و دابەزینی نەزانی و خواردنەوەی مەشروب و بەئاشکرایی و زۆربوونی زینا[١].

٢. عَنْ أَبِي وَائِلٍ، قَالَ: كُنْتُ جَالِسًا مَعَ عَبْدِ اللهِ، وَأَبِي مُوسَى، فَقَالَا: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): "إِنَّ بَيْنَ يَدَيِ السَّاعَةِ أَيَّامًا يُرْفَعُ فِيهَا الْعِلْمُ، وَيَنْزِلُ فِيهَا الْجَهْلُ، وَيَكْثُرُ فِيهَا الْهَرْجُ، وَالْهَرْجُ: الْقَتْلُ".

لە "ئەبو وائل"ـەوە دەڵێت: ئێمە دانیشتبووین لای عبدالله و ئەبی موسا گوتیان رسول الله فەرموویەتی: لەنێوان هاتنی قیامەت دا ڕۆژانێک هەیە یان سەردەمانێک هەیە کەوا عیلم یان زانست بەرز دەکرێتەوە و جەهل یان نەزانی دادەبەزێت هەرەج زۆر دەبێت، واتە کوشتن[٢].

---

(١) صحيح مسلم، بخاری.

(٢) بخاری و مسلم ڕیوایەتیان کردووە.

٣. أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): "يَتَقَارَبُ الزَّمَانُ، وَيُقْبَضُ الْعِلْمُ". ثُمَّ ذَكَرَ مِثْلَهُ.

ئەم جارەیان لە ئەبو هرێرەوە دەڵێت: رسول الله (ﷺ) فەرموویەتی: کات نزیک دەبێتەوە، هەروەها عیلم یان زانست نامێنێت یان هەڵدەگیرێت.

ئەمانە و چەندان لەفزی تر لەکۆمەڵێک هاوەڵی تر دووپاتی ئەم شتە دەکەنەوە. هەروەها بەپێی واقع و حەدیث ئەم شتە ڕوویداوە و یەکێکە لە نیشانە بچووکەکان، کەوا زانایان دایانناوە. هەروەها باسەکە تایبەتە بە فتن و ملاحم و علومی اشراط. کەواتە بەپێی زانستی نیشانەکان ئێمە لەسەردەمی جەهلین زۆر سەختە، بۆیە دوای ڕوونکردنەوەی خاڵەکانی تر، خاڵ بە خاڵ بەپێی زانستی نیشانەکان دواتر بەپێی علوم الحدیث چارەسەرەکەیتان پێ دەڵێم.

**دووەم: نەمانی زاناکان.**

زۆر گرنگە بۆ ئەهلی ئیمان لە ئێستادا زانینی ئەم شتە چونکە ئیمان هێنان و شوێنکەوتن و دۆزینەی حەق لەنێو فیتنە زۆر جیاوازە لەکاتی ئاسایی.

نەمانی زاناکان: ئێمە بەپێی زانستی نیشانەکانی قیامەت ئێمە ئێستا لەکاتی نەمانی زانادایین. زاناش واتە عیلم. وەک لە فەرموودەیەدا هاتووە:

عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: "إِنَّ اللهَ لَا يَقْبِضُ الْعِلْمَ انْتِزَاعًا يَنْتَزِعُهُ مِنَ الْعِبَادِ، وَلَكِنْ يَقْبِضُ الْعِلْمَ بِقَبْضِ الْعُلَمَاءِ، حَتَّى إِذَا لَمْ يُبْقِ عَالِمًا اتَّخَذَ النَّاسُ رُءُوسًا جُهَّالًا، فَسُئِلُوا فَأَفْتَوْا بِغَيْرِ عِلْمٍ، فَضَلُّوا وَأَضَلُّوا".

عبدالله بن عمر دەڵێت: گوێم لە رسول الله (ﷺ) بوو دەیفەرموو: الله زانست و دین ڕاستەوخۆ لەخەڵک یان بەندەکانی وەرناگرێتەوە و لێیان بسەنێتەوە، بەڵکو زانا و دانایان لەنێو ناهێڵێت. تاوەکو وای لێدێت خەڵک زانا و سەرکردەی گومڕا دەکەنە پێشەوایان پرسیاریان لێی دەکەن. ئەوانیش فتوا دەدەن بێ عیلم گومڕایان دەکەن و خۆشیان گومڕان[1].

حافظ ابن حجر لە فتح ـدا دەڵێت: واتە سڕینەوەی عیلم لەسەر سینگیان یان دڵیان.

هەروەها ابن حجر لە فتح ـدا هەر لە شەرحی ئەم حەدیثەدا هێناویەتی کەوا ئیمامی ئەحمەد و طبرانی هێناویانە لە "ئەبی امام"ـەوە، لەکاتی حەجی ماڵ ئاواییدا رسول الله بەخەڵکەکەی فەرموو: عیلم یان زانست وەربگرن و فێربن، بەرلەوەی نەمێنێت یان بەرزبێتەوە. ئەعرابییەک واتە دەشتەکییەک پرسی: چۆن بەرز دەبێتەوە؟ فەرمووی: ئایا نازانن ڕۆیشتنی عیلم، ڕۆیشتنی هەڵگرانیەتی، سێ جار وای فەرموو.

---

(١) ئەم حەدیثە (متفق علیه)یە واتە بخاری و مسلم ڕیوایەتیان کردووە.

هەروەها نووی لە منهاج ـدا دەڵێت: ئەم حەدیثە تەعبیرە و ئاماژەیە بەوەی کەوا نەمانی عیلم، واتای ڕەشکردنەوەی نییە لەسەر دڵی حافظەکان. بەڵکو بەمردنی هەڵگرانی واتە زاناکان دەبێت. ئنجا خەڵکی کەسانی جاهل و نەزان دەکەنە پێشەوا و، ئەوانیش حوکم بە جاهیلیەتی و نەزانییەکەیان دەدەن گومڕایان دەکەن و خۆشیان گومڕان(١).

گەر سەیری واقیعی ئێستاش بکەین، زۆر بەڕوونی ئەم شتە دەبینرێت زاناکان یان مردوون یان لە زیندانن. دەبینن چۆن کەسانی گومڕا بوونەتە موفتی خەڵک و، خەڵکیش خۆیان شوێنیان کەوتون و گومڕایان دەکەن. بەڵێ تەنانەت ئایەت و حەدیث ڕەفز دەکات، ئەگەر شێخەکەی ڕای وانەبێت.

## سێیەم: زانا و پێشەوای گومڕاکار.

لە خاڵەکانی تر باسی ئەوەمان کرد ئێمە لەسەردەمی جەهل و بێ عیلمی و نەمانی زاناکان داین. ئنجا هەر لەدرێژەی ئەم بەشە دێینە سەر چەند باسێکی تر ئەمیش بوونی پێشەوا و ئیمامی گومڕاکارن.

ئیمامی ئەبو داود لە سنن لەکتابی الفتن والملاحم ـدا بەژمارە (٤٢٥٢) هێناویەتی لە هاوەڵی بەڕێز "ثوبان" کەوا فەرموودەکە درێژە، بەڵام ئەمەم لێ دەرهێنا بەم شێوەیە: (وَإِنَّمَا أَخَافُ عَلَى أُمَّتِي الأَئِمَّةَ الْمُضِلِّينَ).

---

(١) سەیری شەرحی منهاج ـی نووی بکە لە کتابی العلم.

واتە ئەوەی من ترسم لێی هەیە لەسەر ئوممەتەکەم پێشەوا و کەسانی گومڕاکارن.

هەروەها ئیمامی ابن ماجە لە سننەکەیدا لەکتابی الفتن هێناویەتی بەژمارە (٣٩٥٢) بەهەمان شێوەی سنن ابی داود: (وَإِنَّ مِمَّا أَتَخَوَّفُ عَلَى أُمَّتِي أَئِمَّةً مُضِلِّينَ).

وەک گوتم، ئەوەی جێگای سەرنجە ئەوەیە ئەوان ئەم باسەیان لە کتابەکانی فتن و ملاحم هێناوە، واتە حاڵەکە تایبەتە وەک لەسەرەوە ئاماژەم پێداوە بەپێی زانستی نیشانەکان. کەواتە ئێستا ئەم سەردەمە چونکە عیلم نەماوە هەروەها زاناکان نەماون، ئنجا زانا و پێشەوای گومڕاکار پەیدا دەبن.

ئەئمە واتە بانگخواز و زانا و ئیمامی گومڕاکار. لەڕاستیدا ئیمام نین، بەڵکو خەڵک وەک زانا و ئیمام سەیریان دەکات، ئەوانیش خەڵک گومڕا دەکەن. هەروەها لە فەرمودەی تر هاتووە رسول الله (ﷺ) دەفەرمووێت: بانگخوازانێک لەبەر دەرگای جەهەنەمدا وەستاون، هەریەک وەڵامیان بداتەوە دەیخەنە ناوییەوە.

ئەم فەرمودەیەش پشتگیری فەرموودەکانی سەرەوەن، بۆیە وریابن و بزانن کە نابێت و نابێت بەهێچ جۆرێک وەڵامیان بدرێتەوە و گوێیان لێ بگیردرێت چونکە گومڕاتان دەکەن و دەتانخەنە نێو جەهەنەم پەنا بە الله.

**چوارەم: لە دەستدانی ئیمان.**

یەکێک لە فەرموودە هەرە مەترسیدارەکان لەسەر فیتنە هاتووە. ئەمیش بەمشێوەیەیە کەوا هەریەک لە ئیمامی مسلم و ئیمامی ترمزی هێناویانە هەموویان لە هاوەڵی بەڕێز ئەبوو هرێرەوە بەم شێوەیە:

بَادِرُوا بالأعْمَالِ فِتَنًا كَقِطَعِ اللَّيْلِ المُظْلِمِ، يُصْبِحُ الرَّجُلُ مُؤْمِنًا وَيُمْسِي كَافِرًا، أَوْ يُمْسِي مُؤْمِنًا وَيُصْبِحُ كَافِرًا، يَبِيعُ دِينَهُ بعَرَضٍ مِنَ الدُّنْيَا.

واتە پەلەبکەن لەکرداری چاک، پێش هاتنی فیتنە وەک شەوی تاریک بەسەرتاندا دێت. بەیانی پیاو ئیماندارە و شەوەکەی کافرە، یان شەو ئیماندارە بەیانی کافرە. دینیان بە شتێکی کەمی دونیا دەفرۆشن.

(بادروا) واتە خێرابکەن یان پەلەکەن. سبحان الله واتە هێندە زۆرە فیتنە کەوا بەدوای یەک و لەسەر یەک، تەنانەت هیچ ئیماندارێک ناتوانێت تەنها یەک ڕۆژ کەفالەتی ئیمانی خۆی بکات.

ئەم فەرموودەیە دەرکەوتووە والله اعلم چونکە لەسەرەوە باسم کرد خاڵ بەخاڵ. کاتێک کەوا سەردەمی جەهل و نەفامی و نەمانی زانا و دەرچوونی پێشەوا و بانگخوازی گومڕاکەر بێت، گومانتان نەبێت دەرچووە، بەڵێ فیتنە لەوەی تاریک تر نییە. بۆیە دەفەرمووێت دینەکەی واتە ئیمانەکەی بەشتێکی کەمی دونیا دەفرۆشێت، بۆیە بەڕاستی دەمەوێت پێتان بڵێم لە ناخۆشترین کات و سەردەم داین سەختە بۆ

ئیماندار کە نەتوانێت یەک ڕۆژ ئیمانی سەلامەت بکات لەبەر فیتنە. بۆیە رسول الله (ﷺ) دوعای دەکرد و دەیفەرموو: اللهم انا نعوذ بك من الفتن ما ظهر منها وما بطن. واتە ئەم فیتنانەی ئاشکرا و دیارن و هەروەها ئەوانەش ناڕون و دیار نین.

## بەشی چوارەم: ڕزگاربوون لە فیتنە بەپێی (علمی حدیث زانستی فەرموودە.

دوای زانینی سەردەمی فیتنە لەزانستی نیشانەکان و ڕوونکردنەوەی حاڵی ئوممەت و مەترسیەکانی ئەم سەردەمە. پشتیوان بە الله باسی ئەوە دەکەین چی بکەین و چی بکرێت لەم جۆرە سەردەمانە، ئەویش بەپێی عیلمی حەدیث، چونکە بەڵێنم دابوو هەر سێ زانستەکەی تێدا بەکاربهێنم. زانستی فەرموودە یان علم الحدیث پێشووتر کتابێکم لەسەری نوسیووە بەوردی باسی ئەم زانستەم کردووە، بۆیە ناچمە نێو وردەکاری ئەوەی هەیە.

### یەکەم: لە عیلمی جرح و تعدیل تەنیا کەسانی ثقە.

زانایان لە زانستی فەرموودە و هەروەها لەنێو زانستەکەش زانستی (جرح وتعدیل) تایبەتە بە (رجالی حدیث) پیاوانی فەرموودە. بۆیە کاتێک هاتوون بۆنمونە، ئیمامی بوخاری یان موسلیم یان ئەحمەد کاتێک فەرموودەیان لە ڕاوییەک گێڕاوەتەوە، سەیریان کردووە لەنێو

سەنەدەکان وەک ئەم نمونە: حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ (﵁)، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ). ئەمە نمونەی سەنەدی فەرموودەیەکە لە صەحیح بوخاری ڕاوییەکان بریتین لە ئیمامی بخاری، مسدد، یحیی، شعبه، قتاده، ئنجا أنس، ئنجا لە رسول اللهوە. بۆیە زانایانی جەرح و تەعدیل یەک بەیەک لە ڕاوی نێو سەنەدەکە دەکۆڵنەوە بزانن جێگای متمانەن یان نا. لەسەر "مسدد" ثقةیە واتە متمانە پێکراوە لە حفظ و ئیمان. "یحیی" یحیی بن سعید القطان الحافظ ئەمیش ئیمام بووە و، حجە بووە. هەروەها "شعبە"ش شعبە بن الحجاج پێشەوا و ئیمام بووە. "قتادە"ش حجە و ثقة و پێشەوا بووە. ئەمانە لەلایەن زانایانی جەرح و تەعدیل دیاری دەکرێن، بۆنمونە یحیی بن معین بۆ مسدد یحیی بن سعید بۆ شعبە شعبەش بۆ قتادە. بۆیە ئەگەر کەسێک تاوانبار (متهم) کرابێت بە کذب واتە درۆ، فەرموودەیان لێ وەرنەگرتووە. هەروەها دەبێت ئەم کەسە عدل بێت و حافظ بێت. ئنجا فەرموودەیان لێوەرگرتووە.

کەواتە دین هەر وا ئاسان نییە دەبێت ئەو کەسەی دینی لێ وەر دەگرن ثقە و متمانە پێکراو بێت. دواتر ڕوونی دەکەینەوە مەترسییەکانی بۆ چییە.

**دووەم: نابێت دین لەهەموو کەس وەربگیردرێت.**

**(زۆر گرنگە).**

هەر لە زنجیرە باسی ڕێگاکانی ڕزگار بوون لە فیتنەکانی ئاخر زەمان و چۆنیەتی خۆپاریزی و زانین و ناسینی فیتنەکان. هەروەها لەڕێگەی ڕزگاربوون بەپێی زانستی فەرموودە و عیلمی جەرح و تەعدیل.

ئیمامی موسلیم لە صەحیحەکەی پێش دەستپێک نزیکەی (سەد) فەرموودە و ئەثەر و ئەقوالی زانایانی لەبارەی ئەم شتەوە هێناوە یەکێک لەبابەکان بەناوی: بَابٌ: بَيَانُ أَنَّ الْإِسْنَادَ مِنَ الدِّينِ، وَأَنَّ الرِّوَايَةَ لَا تَكُونُ إِلَّا عَنِ الثِّقَاتِ، وَأَنَّ جَرْحَ الرُّوَاةِ بِمَا هُوَ فِيهِمْ جَائِزٌ بَلْ وَاجِبٌ.

سەنەد بریتییە لە دین، سەنەدی حەدیث واتە ناسینی کەسەکانی نێو فەرموودەکان و، دەڵێت: ڕیوایەتی نابێت و ناکرێت تەنیا لە کەسانی متمانە پێکراو نەبێت. ئنجا دیاریکردنی کەسانی (مجروح) واتە کەسێک -متهم- تاوانبار بێت بەدرۆ یان حفظی لاواز بێت یان هەرشتێک ببێتە هۆی لەدەستدانی متمانە، دەڵێت: واجبە لەسەر موسڵمان و ئەهلی عیلم ئەم کارەبکەن و چەند ڕیوایەت و ئەقوالی زانایان دەهێنێت ئەمانیش: (عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ قَالَ : إِنَّ هَذَا الْعِلْمَ دِينٌ، فَانْظُرُوا عَمَّنْ تَأْخُذُونَ دِينَكُمْ)[١]. واتە ئەم عیلمە یان زانستە، دینە. بزانن لە کێ دینتان وەردەگرن کەواتە دەبێت بزانن دینتان لەکێ وەردەگرن. هەروەها هێناویەتی: عَنِ ابْنِ سِيرِينَ قَالَ: لَمْ يَكُونُوا يَسْأَلُونَ عَنِ الْإِسْنَادِ، فَلَمَّا وَقَعَتِ الْفِتْنَةُ، قَالُوا:

---

(١) ئەم ئەثەرە ئیمامی الدارمی لە مقدمەی سننەکەی هێناویەتی لەگەڵ ئیمامی موسلیم.

سَمُّوا لَنَا رِجَالَكُمْ، فَيُنْظَرُ إِلَى أَهْلِ السُّنَّةِ فَيُؤْخَذُ حَدِيثُهُمْ، وَيُنْظَرُ إِلَى أَهْلِ الْبِدَعِ فَلَا يُؤْخَذُ حَدِيثُهُمْ[(١)].

تابعی بەڕێز و گەورە محمد بن سیرین دەفەرمووێت: پرسیاری سەنەد نەدەکرا لەسەرەتادا، بەڵام کاتێک فیتنە سەریهەڵدا گوتمان ناوی پیاوەکانتان بهێنن و بیڵێن. سەیری ئەهلی سوننەمان دەکرد لێمان وەردەگرتن. سەیری ئەهلی بیدعەمان دەکرد لێمان وەرنەدەگرتن.

ئەمەی ئەم زانایە دەیڵێت زیاتر لە (١٣٥٠) ساڵ پێش ئێستا بووە. سەردەمی زێڕین و خیر القرون بووە. ئنجا ئاوابوون کەواتە نابێت دین و عیلم وەربگیردرێت تەنیا لەکەسانی متمانە پێکراو و ئەهلی سوننە نەبێت. دواتر زیاتر ڕوونی دەکەینەوە. هەروەها هێناویانە بەم شێوەیە: عَنْ مِسْعَرٍ، قَالَ: سَمِعْتُ سَعْدَ بْنَ إِبْرَاهِيمَ يَقُولُ: لَا يُحَدِّثُ عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) إِلَّا الثِّقَاتُ[(٢)].

مسعر بن کدام لە سعدی کوڕی ئیبراهیم ـەوە، واتە نابێت قبوڵ بکرێت لە رسول اللهوە (ﷺ) تەنیا کەسانی متمانە پێکراو نەبێت.

هەروەها عَبْدَ اللهِ بْنَ الْمُبَارَكِ، يَقُولُ: الْإِسْنَادُ مِنَ الدِّينِ، وَلَوْلَا الْإِسْنَادُ لَقَالَ مَنْ شَاءَ مَا شَاءَ.

---

(١) ئەم ئەثەرەش ئیمامی مسلم و ئیمامی الدارمی هێناویانە لە مقدمەکانیان.

(٢) مسلم، الدارمی.

ابن مبارك دەفەرمووێت: سەنەد واتە پیاوانی نێو فەرموودە کە پێی دەڵێن سەنەد لە دین، گەر ئیسناد نەبێت هەریەک بیەوێت دەیلێت و دەیهێنێت.

هەروەها ئیمامی موسلیم هێناویەتی بەمشێوەیە:

وَقَالَ مُحَمَّدٌ: سَمِعْتُ عَلِيَّ بْنَ شَقِيقٍ يَقُولُ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ الْمُبَارَكِ يَقُولُ عَلَى رُءُوسِ النَّاسِ: دَعُوا حَدِيثَ عَمْرِو بْنِ ثَابِتٍ، فَإِنَّهُ كَانَ يَسُبُّ السَّلَفَ.

محمد دەڵێت: گوێم لە علی بن شقیق بوو دەیگوت: گوێم لە عبد اللهی کوڕی مبارك بوو دەیگووت: لەسەر ڕووی هەموو خەڵک واز لە فەرموودەی "عمرو بن ثابت" بێنن چونکە جنێو بە سەلەف دەدات.

کەواتە بەپێی ئەم بەڵگانە نابێت دین و علم لەهەموو کەسێک قبوڵبکرێت تاوەکو متمانەپێکراو نەبێت. هەروەها نابێت لەئەهلی بیدع بێت. هەروەها دەبێت لە عەقیدەش ئەهلی سوننە بێت.

**سێیەم: علمی مصطلح الحدیث زانستی زاراوەکانی فەرموودە**

لەم باسەدا بەپێی زانستی زاراوەکانی فەرموودە واتە (علم مصطلح الحدیث) بۆتان ڕووندەکەینەوە چیبکەین و چی پێویستە لەسەرمان بۆ ڕزگاربوون لەم گێژاوی فیتنەیە.

١. لەسەرەتادا زانستی زاراوەکان، زانستێکی تایبەتە لەنێو زانستی فەرمووده. ئەویش خۆی دەبینێتەوە لە جۆرەکانی حدیث وەک صحیح، حسن، ضعیف بۆنمونە مەرجەکانی قبوڵبوونی حەدیث یان بۆئەوەی ببێتە صەحیح ئەمانەن:

**یەکەمیان:** ڕاوی عدل بێت زۆر گرینگە، واتە پێشووتر گوتمان ئەم عیلمە دینە، بۆیە زاناکان مەرجی قورسیان داناوە بۆ قبوڵبوونی (عدل و مستقیم بێت) واتە ڕاگیراو بێت لەسەر دین، نەگۆڕابێت. هەروەها توانای لەبەرکردن -حفظ-ی بەهێز بێت.

**دووەمیان:** هەروەها نابێت فاسق بێت. کما **قَالَ اللهُ تَعَالَىٰ:**﴿إِن جَآءَكُمۡ فَاسِقُۢ بِنَبَإٖ فَتَبَيَّنُوٓاْ﴾.

**سێیەمیان:** نابێت ناوەڕۆکی شاذ بێت.

**چوارەمیان:** نابێت عیلەی تێدابێت.

لەبەرامبەردا جگە لە (حسن) چونکە (حسن) لای ئیمامی ترمزی، نابێت ڕاوی تاوانبار -متهم- بێت بەدرۆ و لەبەرکردنی کەمێک لاوازبێت. بۆیە ئەگەر ڕاوی واتە ئەوەی کە حدیث نەقڵ دەکات تاوانبار -متهم- بێت بەدرۆ و، لەبەرکردنی لاواز بێت. هەروەها عدل نەبێت و فاسق بێت، ئەوە دەچێتە پلەی ضەعیف و ناکرێتە بەڵگە و دین بەسەرمان. تەنانەت ئەگەر هەموو ڕاوییەکان جێی متمانە (ثقە) و دامەزراو لەسەر

دین (ثبت) و جێی بەڵگە (حجە) بن تەنیا یەک ڕاوی تاوانبار -متهم- بێت و جێگای متمانە نەبێت، ئەوە ئەم دینە واتە فەرموودە وەرناگیردرێت.

٢. مجهول یان مبهل.

ئەم وشەیەش تایبەتە بەم عیلمە. بۆنموونە زۆر جار دەڵێین دین لە مەجهول وەرناگیردرێت، دین واتە عیلم، عیلم واتە دین. بۆیە کاتێک حەدیثێک لەسەنەدەکەی کەسێک هەبێت دیار نەبێت وەک ئەم نموونە: حَدَّثَنَا الْفَضْلُ بْنُ يَعْقُوبَ، حَدَّثَنَاعَبْدُ الْأَعْلَى، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِسْحَاقَ، حَدَّثَنَا الْعَلَاءُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْحُرَقِيُّ، عَنرَجُلٍ مِنْ سَهْمٍ، عَنِ ابْنِ مَاجِدَةَ، عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ (رضي الله عنه)، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ). ئەم فەرموودەیە لە سنن أبی داود هاتووە، دوو ڕاوی تێدایە حاڵیان ونە و دیار نییە. ئەوانیش هەریەک لە (عن رجل من سهم) لەگەڵ (ابن ماجدة)یە. بۆیە وەرناگیردرێت، بەهۆی ئەوەی نازانرێت ئەم دوو کەسە جێگای متمانەبوونە یان درۆزن بوونە. بۆیە هەتاوەکو حاڵی نەزانرابێت قبوڵ نەکراوە. بۆیە کاتێک دەڵێیت (فڵان کەس) وا دەڵێت ئەم فڵانە کێیە و کێ نییە. کێ دەڵێت درۆزن نییە یان شەیطان نییە.

٣. لێکدانەوەی عیلمەکان.

لەخاڵی یەکەم و دووەم بەپێی عیلمی مصطلح الحدیث چەند شتێکی گرنگمان باس کرد کە لەوانە بڵێین ئەوە چی پەیوەندی بەڕزگاربوون و

ئەم سەردەمەوە هەیە! بۆنمونە کە دەڵێین دین نابێت لە مەجهول وەربگیردرێت یان دەبێت درۆزن یان فاسق نەبێت.

ئیمامی موسلیم لە صحیح مسلم لە مقدمەکەیدا هەندێک فەرموودەی بۆ هێناوین باس لە مەترسییەکانی ئەم سەردەمەمان بۆ دەکاتن ئەمانیش:
عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنْ رَسُولِ الله (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: "سَيَكُونُ فِي آخِرِ أُمَّتِي أُنَاسٌ، يُحَدِّثُونَكُمْ مَا لَمْ تَسْمَعُوا أَنْتُمْ وَلَا آبَاؤُكُمْ، فَإِيَّاكُمْ وَإِيَّاهُمْ"[١].

ئەبو هرێرە لە رسول اللهوە (ﷺ) فەرموویەتی: لەکۆتا ئوممەتی من خەڵکانێک پەیدا دەبن شتانێکتان بۆ باس دەکەن، نە ئێوە بیستووتانە نە باوباپیرانتان. بۆیە وریای ئەوان و خۆتان بن.

مُسْلِمُ بْنُ يَسَارٍ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ الله: "يَكُونُ فِي آخِرِ الزَّمَانِ دَجَّالُونَ كَذَّابُونَ، يَأْتُونَكُمْ مِنَ الْأَحَادِيث بِمَا لَمْ تَسْمَعُوا أَنْتُمْ وَلَا آبَاؤُكُمْ، فَإِيَّاكُمْ وَإِيَّاهُمْ، لَا يُضِلُّونَكُمْ وَلَا يَفْتِنُونَكُمْ"[٢].

واتە رسول الله (ﷺ) دەفەرمووێت: لەکۆتا زەمان دەجالانێکی درۆزن پەیدا دەبن. باس و حەدیثی واتان بۆ دەهێنن کەوا نە خۆتان نە باو و باپیرانتان گوێتان لێبووە. بۆیە ئاگاداریان بن و ئاگاداری خۆتان بن با گومڕاتان نەکەن و توشی فیتنەتان نەکەن.

---

(١) مقدمەی مسلم

(٢) مقدمەی مسلم

قَالَ عَبْدُ اللهِ: إِنَّ الشَّيْطَانَ لِيَتَمَثَّلُ فِي صُورَةِ الرَّجُلِ، فَيَأْتِي الْقَوْمَ، فَيُحَدِّثُهُمْ بِالْحَدِيثِ مِنَ الْكَذِبِ، فَيَتَفَرَّقُونَ، فَيَقُولُ الرَّجُلُ مِنْهُمْ : سَمِعْتُ رَجُلًا أَعْرِفُ وَجْهَهُ، وَلَا أَدْرِي مَا اسْمُهُ يُحَدِّثُ[١].

عبد اللهی بن مسعود دەفەرموویت: شەیطان خۆی دەکاتە سەر شێوەی مرۆڤ، ئنجا دێت بۆلای قەومێک هەندێک باس و حەدیثی درۆیان بۆ باس دەکات. لێک دەبنەوە یەکێک لەوان دەڵێت: گوێم لە پیاوێک بوو شێوەی دەناسم، بەڵام نازانم ناوی چی بوو ئەو باسی کرد.

ئەی سبحان الله وەک پێم گوتن فڵان کەس کێ ناڵێت شەیطان نییە. بۆیە مەجهول و مبهم دینیان لێوەرناگیردرێت هەتا نەناسرێت و جێی متمانە نەبن.

عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ قَالَ: إِنَّ فِي الْبَحْرِ شَيَاطِينَ مَسْجُونَةً أَوْثَقَهَا سُلَيْمَانُ، يُوشِكُ أَنْ تَخْرُجَ، فَتَقْرَأَ عَلَى النَّاسِ قُرْآنًا[٢].

عبد الله بن عمر و بن العاص دەفەرموویت: لەنێو دەریاکان شەیطانانێک هەن، کەوا زیندانیکراون لە لەلایەن "سلێمان"ـەوە علیه سلام. ڕۆژێک دادێت دەربچن و قورئان بەسەر خەڵکیدا بخوێنن.

---

(١) مقدمەی مسلم

(٢) مقدمەی مسلم

یا سبحان الله چەند ترسناکە شەیطان قورئان ناخوێنێت. لێرەدا مەبەستی ئەوەیە خەڵک وەک قورئان سەیری دەکات. وەک لە فەرموودەکانی سەرەوە باسمان کرد بە هەندێک باس و بابەت لەدین دێن، کەوا هەرگیز ئێمە و باپیرانمان نەمان بیستووە. بۆیە خەڵک وادەزانێت قورئانە، واتە وەک دین سەیری دەکات بەمەش گومڕا و سەرلێشێواو دەبن.

لەم بەشەدا بۆمان دەرکەوت هەتاوەکو کەسێک عەقیدەی پاک نەبێت و دیار نەبێت و ڕاستگۆ نەبێت و نابێت درۆزن بێت، هەروەها نابێت فاسق بێت و، نابێت دین لە کەسانی نەناسراو وەربگرین. دین واتە زانست، زانستیش واتە دین. بۆیە وریابن با شەیطانی ئینس و جن گومڕاتان نەکەن. ئێمە لە کۆتا زەمانین لەسەردەمی پڕ فیتنەین.

## بەشی پێنجەم: دورکەوتنەوە لەپێناو پاراستنی ئیمان.

پشتیوان بە الله باسی چەند چین و کەسانێک دەکەین کەوا پێویستە وازیان لێبهێنرێت و لێیان بەدوور بین ئەوانیش.

**یەکەم: کەسانی متشابهـ دروستکەر.**

عن عائشة، قالت: "تلا رسول الله (ﷺ) هذه الآية: ﴿هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۡهُ ءَايَٰتٞ مُّحۡكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٞۖ﴾[1].

حتى بلغ: ﴿وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ٢٦٩﴾[2].

فقال رسول الله: "إذا رأيتم الذين يتبعون ما تشابه منه، أولئك الذين سماهم الله فاحذروهم"[3].

لە دایکمان عائیشەوە دەفەرمووێت: رسول الله (ﷺ) ئەم ئایەتەی سەرەوەی خوێند لە آل عمران. دواتر فەرمووی: کاتێک ئەوانەتان بینی شوێن ئایەتی متشابهـ دەکەون، وریایان بن ئەمە ئەوانەن کەوا الله ناوی ناون. واتە کەسانی دڵ نەخۆش، کەسانێک شوێن ئایەت و فەرموودەی متشابهـ دەکەون دەڵێن: بۆچی لێرە ئاوایە و لەوێدا وانییە. ئەمانە کەسانی گومڕان، بۆیە پێویستە لێیان دووربین چونکە گومڕاتان دەکەن.

**دووەم: بیدعە و کەسانی موبتەدیع.**

پێویستە بزاندرێت کەوا هەڵوێستی سەلەف چۆن بووە لەسەر کەسانی موبتەدیع. ئەمیش ئەوانەن کەوا تەئویلی عەقڵی و پوچ بۆ ئایەت و

(١) آل عمران: ٧

(٢) البقرة: ٢٦٩

(٣) أخرجه البخاري ومسلم.

حەدیثەکان دەکەن و گومڕاکەرن و خۆشیان گومڕان. هەروەها یان کەسانێک شوێن هەوای نەفسیان دەکەون، وەک:

عن الشعبي، قال: إنما سميت الأهواء لأنها تهوي بصاحبها في النار[١].

ئیمامی شعبی دەڵێت: بۆیە ناونراوە هەواء، چونکە خاوەنەکەی فڕێدەداتە ناو ئاگرەوە.

هەروەها ئیمامی حسن البصری دەڵێت: کەسانی خاوەن هەوا و هەوەس و نەفس و موبتەدیع وەک یەهود و نەصارا وان[٢].

هەروەها فەرمووی: كان الحسن يقول: لا تجالسوا أهل الأهواء، ولا تجادلوهم، ولا تسمعوا منهم.

لای کەسانی موبتەدیع دامەنیشن و مناقەشەشیان لەگەڵ مەکەن و گوێشیان بۆ مەگرن.

سفیان الثوری دەڵێت: بیدعە واتە داهێنراو لای ئیبلیس زۆر خۆشەویسترە لە تاوان.

(١) اعتقاد أهل السنة أبو القاسم ألالكائى.

(٢) اعتقاد أهل السنة أبوالقاسم ألالكائى.

واته مەعصیه، چونكه تاوان تۆبەی بۆ هەیە، بەڵام بیدعه نەخێر[1]. چونكه هەموو بیدعەیەک گومڕاییه و بۆ ئاگره. هەروەها هاتووه بەمشێوەیە:

أخبرنا الحسن بن عثمان، قال: أخبرنا أحمد بن الحسن، قال: حدثنا سليمان بن الأشعث، قال: حدثنا يعقوب بن إبراهيم، قال: حدثنا سعيد بن عامر، قال: سمعت إسماعيل يحدث قال: "دخل رجلان على محمد بن سيرين من أهل الأهواء فقالا: يا أبا بكر نحدثك بحديث؟ قال: لا. قالا: فنقرأ عليك آية من كتاب الله؟ قال: لا. قال: تقومان عني، وإلا قمت. فقام الرجلان فخرجا، فقال بعض القوم: ما كان عليك أن يقرأ آية؟ قال: إني كرهت أن يقرأ آية فيحرفاها فيقر ذلك في قلبي.

واته دوو پیاو لە ئەهلی ئەهوائـ واته موبتەدیع، دەچنه لای محمدی کوڕی سیرین و پێی دەڵێن: ئەی باوکی بکر حەدیثێکت بۆ باس بکەین. دەڵێت: نەخێر. دەڵێن: باشە ئایەتێکت لە قورئان بۆ دەخوێنین. دەڵێت: نەخێر. ئنجا پێیان دەڵێت: یان هەڵدەستن و دەڕۆن یان من دەڕۆم. ئەوانیش شوێنەکە بەجێدەهێڵن. هەندێک لەوان بە ابن سیرین دەڵێن: بۆچی ڕێگەت نەدا قورئان بخوێنن؟ فەرمووی: حەزم نەکرد ئایەتێک بخوێنن و تەئویل و تەحریفی پوچی بکەن و لەدڵمدا جێگیر بێتن.

---

(١) اعتقاد أهل السنة أبو القاسم ألالكائی.

بەڵێ، سەلەف ئاوابوون بەرامبەر ئەم جۆرە کەسانە. هەروەها پێشەوا ئەیو السختیانی دەڵێت: ئەبو قلابە فەرمووی: هەر گەلێک داهێنراوێکیان داهێنابێت لەدین، ئەوە شمشێریان لەسەر حەڵاڵ بووە. هەروەها عبدالرزاق لە "معمر"ـەوە دەڵێت: ابن طاوس بن کیسان دانیشتبوو. کەسێکی موعتەزیلە هاتوو دەستی بەقسان کرد. ابن طاووس دەستی بەگوێیەکانی گرتبوو. هەروەها بە کوڕەکەی دەگووت: ئەی کوڕم دەست بەگوێیەکانت بگرە و، بەتوندی با گوێت لە هیچ قسەیەکی نەبێت. معمر دەڵێت: واتە دڵی مرۆڤ لاوازە.

سبحان الله ئەمانە خیر القرون بوون تابعی و زانا بوون و پێشەوا بوون لەدین کەچی ترساون لە کەسانی موبتەدیع. بەهیچ جۆرێک هاوڕێیەتیان نەکردوون، لەخۆیان ئەمین نەبوون. کەچی ئێمە بەم کەم عیلم و عیبادەتەمان، نان و ئاویشیان لەگەڵ دەخۆین.

هەروەها عن الأوزاعي، عن يحيى بن أبي كثير، قال: إذا لقيت صاحب بدعة في طريق فخذ في غيره.

ئیمامی ئەوزاعی لەیحیی بن کثیر دەڵێت: ئەگەر گەیشتی بەکەسێکی خاوەن بیدعە لەڕێگایەکدا، تۆ ڕێگایەکی پێچەوانەوە بگرە.

هەروەها سمعت إسماعيل الطوسي قال: قال لي ابن المبارك: يكون مجلسك مع المساكين، وإياك أن تجالس صاحب بدعة.

إسماعيل الطوسي دەڵێت: عبدالله بن مبارك پێی گوتم: با دانیشتەکانت لەگەڵ هەژاران بێت و وریابە لەدانیشتن لەگەڵ کەسانی خاوەن داهێنراو لەدین.

هەروەها پێشەوا فضیل بن عیاض دەڵێت: دامەنیشە لەگەڵ کەسانی خاوەن بیدعە. دەترسم لەعنەت دابەزێتە سەرتان.

دیسانەوە ئیمامی فضیل دەفەرمووێت: کەسانی خاوەن بیدعە لە دینت ئەمین نین. هەروەها ڕاوێژیان لەکارەکانت پێمەکە. هەروەها لەگەڵیان دامەنیشە. ئەوەی لەگەڵ موبتەدیعێک دابنیشێت، الله کۆڵەواری پێ دەبەخشێت.

پێشەوا فضیل دەفەرمووێت: گەیشتووم بەچاکترین و هەڵبژێردراوەکانی خەڵک، هەموویان خاوەن سوننەت بوون و ڕێگریان دەکرد لە ئەهلی هەوا و داهێنراو.

ئەمانە و چەندان ئەقوال و ئەثەری تر هەموویان لە کتابی شرح اصول اعتقاد أهل السنةی شێخ ئەبو القاسم دایە. لە ژمارەکانی (١٨٠) بەرەو سەر هەتاوەکو سێسەد.

ئێستا زانیمان نابێت و ناکرێت بەهیچ جۆرێک نە گوێ لەکەسانی موبتەدیع و موشریک ڕابگرین و نە لاشیان دابنیشین. هەروەها ڕێگری بکەین لەوەی لامان دابنیشن، تەنانەت ڕێگە نەدەین قورئانیشمان بۆ

بخوێنن چونکە تابعییە بەڕێزەکان لەخۆیان ئەمین نەبوون! ئەی ئێمەی نەزان چین.

## بەشی شەشەم: ڕزگاربوون لە فیتنەکان بەپێی ئیعتیقادی سەلەف و خیرالقرون.

لەم بەشەدا بەپێی بیروباوەڕی پێشەوایانی سەلەف کەوا لە کتێبە عەقیدەییەکانیان باسیان کردووە، ڕێگای ڕزگاربوون دەست نیشان دەکەین پشتیوان بە الله.

### یەکەم لە اصول السنة إبن أبى زمنين:

دەڵێت: بزانە ڕەحمەتی اللەت لێبێت کەوا سوننەت بەڵگەی قورئانە، نەوەک بە پێکچواندن و هاوشێوە هێنانەوە، وەک قیاس. یان بەهۆی عەقڵەوە بێت، بەڵکو بریتییە لەشوێنکەوتنی پێشەوایان و ئەوەی کەوا جمهوری ئەم ئوممەتە لەسەری ڕۆیشتوون. وەک الله تعالى هەندێک کۆمەڵمان پێ دەڵێت کەوا بەباشترین ستایشیان دەکات ئەوانیش: ﴿فَبَشِّرْ عِبَادِ ﴿١٧﴾ ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمْ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٨﴾﴾. هەروەها فەرمان بەبەندەکانی دەکات بەوەی دەفەرموویت: ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِى مُسْتَقِيمًا فَٱتَّبِعُوهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعُوا۟ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِۦ ۚ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٥٣﴾﴾.

هەروەها إبن أبی زمنین بە سەنەدی خۆی چەند حەدیث و ئەثەرێکی بۆهێناوین بەمشێوە:

عَنْ عَبْد الله بْنِ مَسْعُود قَالَ: خَطّ لَنَا رَسُولُ ا الله (ﷺ) خطًّا، ثُمّ قَالَ: "هَذَا سَبِيلُ الله"، ثُمّ خَطّ خُطُوطًا عَنْ يَمِينِهِ وَعَنْ شِمَالِهِ وَقَالَ: "هَذِهِ سُبُلٌ عَلَى كُلِّ سَبِيلٍ مِنْهَا شَيْطَانٌ يَدْعُو إِلَيْهِ"، وَقَرَأَ ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسۡتَقِيمٗا فَٱتَّبِعُوهُۖ ..﴾. اَلآيَة.

واتە لە عبد الله بن مسعودەوە (رضي الله عنه) عنه دەڵێت: رسول الله (ﷺ) خەتێکی بۆمان کێشا (ئەم وشەیە بەکوردیش لەشێوازی بەکارهێنان دەڵێن: خەت، خەتێک بکێشە). ئنجا فەرمووی: ئەوە ڕێگای اللهیە. پاشان رسول الله دوای کێشانی خەتەکە، چەند خەتێکی لە تەنیشتەکانی لای ڕاست و لای چەپ کرد. ئنجا فەرمووی: ئەوانە ڕێگان، لەسەر هەر ڕێگایەک شەیطانێک هەیە، بانگتان دەکات بۆی. ئنجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسۡتَقِيمٗا فَٱتَّبِعُوهُۖ ..﴾. اَلآيَة.

هەروەها دوو فەرموودەی لە ابن مهدی ئەویش لە حسن هێناوە، بەمشێوەیە:

اِبْنُ مَهْدِيّ قَالَ: وَحَدَّثَنِي مَنْصُورُ بْنُ سَعْدٍ قَالَ: سَمِعْتُ اَلْحَسَنَ يُحَدِّثُ عَنْ اَلنَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: مَنْ رَغِبَ عَنْ سُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّي.

واتە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) هاتووە کەوا هەریەک یان ئەوەی پشت لەسونەتی ئێمە بکات، ئەوە لە ئێمە نییە.

هەروەها اِبْنُ مَهْدِيٍّ قَالَ: وَحَدَّثَنِي مُبَارَكُ بْنُ فَضَالَةَ عَنْ اَلْحَسَنِ بْنِ أَبِي اَلْحَسَنِ، أَنَّهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): عَمَلٌ قَلِيلٌ فِي سُنَّةٍ، خَيْرٌ مِنْ عَمَلٍ كَثِيرٍ فِي بِدْعَةٍ.

واتە دیسانەوە لە رسول اللهوە (ﷺ): فەرمووی کردەوەیەکی کەم لە سوننەتدا، چاکترە لەکردەوەی زۆر لە داهێنراو یان زیادکراو، واتە بیدعە.

تێبینی: (لێکۆڵەر، بەڵام لەبەر ئەوەی پێشەوا حسن بەسڕی ڕاستەوخۆ گوێی لە رسول الله نەبووە، واتە نازانرێت لەنێوان ئەو و پێغەمبەر چەند ڕاوی تر هەیە. ئەگەر تەنها هاوەڵێک بێت ئەوا هاوەڵان بە (إجماعی محدثین عدولن)، بەڵام چونکە حسن بسری تەدلیسی دەکرد، بۆیە ڕاستەوخۆ حوکمی صەحیحی بەسەر نادەین. بەڵام نوسەر واتە ابن أبی زمنین وەک پاڵشتیەک بۆ شوێنکەوتنی سوننەت و دوورکەوتنەوە لەبیدعە هێناویەتی. ئەمە وەک ڕونکردنەوە).

هەروەها لەپێغەمبەرەوە (ﷺ) دەفەرمووێت: هەموو بیدعەیەک گومڕاییە.

تێبینی: (لێکۆڵەر، بیدعە واتە داهێنراو یان شتێک کەوا لە سوننەت نەبێت یان لەدین نەبێت، وەک لە دایکمان عائیشەوە دەفەرمووێت: لە رسول اللهوە (ﷺ) دەفەرمووێت: هەرکەسێک کارێک یاخود کردەوەیەک بهێنێت لە ئێمە نەبێت یان لە کار و فەرمانی ئێمە نەبێت، ئەوا ڕەد و

ڕەتکراوەیە، واتە قبوڵ ناکرێت. ئەوەی سەرەوە بۆم دانان، دووپاتی ئەوە دەکاتەوە کەوا شوێن قورئان و سوننەت و ئەثەری خير القرون بکەوین).

**دووەم: أصول السنة لإمام أهل السنة أحمد بن حنبل (رحمه الله).**

بێگومان بۆ ئیماندار زۆر پێویستە بگەڕێتەوە بۆ ئیعتیقادی سەلەف تاوەکو ڕۆژگاری تاریکی پڕ فیتنەی ئەمڕۆی پێ ڕووناک بکاتەوە.

ئیمامی ئەحمەد دەڵێت: سوننەت لای ئێمە بریتییە لەوەی دەست گرتن بەوانەی کەوا هاوەڵانی ڕەسول لەسەری بوون و هەروەها شوێن کەوتنیان و، وازهێنان لە داهێنراو لەدین، واتە بیدعە. هەموو بیدعەیەک گومڕاییە. ئنجا وازهێنان لە موجادەلە و موناقشە لەسەر دین.

تێبینی: (لێکۆڵەر، ئیمامی ئەحمەد هەر لە دەستپێکی ڕیسالەکەی، شوێنکەوتنی خۆی دووپات کردەوە بۆ خير القرون. گەرچی ئەو قوتابی کۆتا چینی خير القرونە، بەڵام شوێن سەلەفی خۆی کەوت، لەدەست گرتن بە قورئان و حەدیث و ئیعتیقاد. هەروەها جێبەجێکردن و شوێنکەوتنیان بەکردەوە. بۆیە ئەگەر ئیماندار شوێن ئەوان بکەوێت ڕاستەوخۆ هەموو بیدعە و داهێنراوێک وازلێدەهێنێت، چونکە دەزانێت هۆکاری گومڕاییە. هەروەها گەیاندنی حەق وەک خۆی بێ موناقشە و موجادەلەی دڵڕەق کەر).

**سێیەم: لە شرح السنەی البربهاری:**

شێخ بربهاری لەسەرەتای ڕیسالە عەقیدەییەکەیدا دەڵێت: بزانە ئیسلام واتە سوننەت و سوننەتیش واتە ئیسلام، هیچ کامێکیان بێ ئەوەی تریان نابێتن. هەروەها دەڵێت: لە سوننەتدا بریتییە لە دەستگرتن بەکۆمەڵ، هەریەک خۆی لەکۆمەڵ دابڕێ و پشتیان تێبکات، ئەوە ئیسلام لـەگەردەنی بووەتەوە و، هەروەها گومڕا و گومڕاکەرە. هەروەها دەڵێت: بناغەی جەماعە واتە کۆمەڵ، هاوەڵانی رسول الله بوون. ئەوان ئەساسی ئەم بناغەیەن و ئەهلی سوننە و جماعەن. بۆیە دەست نەگرتن بەشوێنکەوتنی ئەوان، گومڕاییە و داهێنراوە و، هەموو گومڕاییەک بۆ ئاگرە.

هەروەها قەولێکی ئیمامی عمر دەهێنێت بۆ عذر یان بیانوو، بۆ هیچ کەسێک نییە کەوا لەگومڕایی بێت و، وا بزانێت لەنێو هیدایەتە و بەپێچەوانەوە.

تێبینی: (لێکۆڵەر، شەرحی سوننەی بربهاری بریتییە لە نامیلکەیەکی عەقیدەیی زۆر گرنگ کە قوتابی قوتابی ئیمام ئەحمەد بوو. هەر لەسەرەتاوە دەڵێت: پێویستە شوێن خیر القرون بکەویت، چونکە ئەوان بناغەی سەرەتایی ئەم دینەن. بۆیە دەڵێت: ئەوەی دەست بەوان نەگرێت، گومڕاییە و داهێنراوە. تیشک بخەنە سەر ئەوەی دەڵێت: (بیدعە)، چونکە

ئەم باسە دینە. بۆیە کاتێک شوێن ئەثەری خیر القرون نەکەویت، دەبێتە شوێنکەوتەی عەقڵ و هەوا و هەوەس، بەمەش بیدعەیە و گومڕاییە).

**چوارەم: اعتقاد أئمة الحديث - أبو بكر الإسماعيلي.**

ئەمەشیان یەکێکە نامیلکە ئیعتیقادییە گرنگەکانی سەلەف، شێخ أبو بكر الإسماعيلی هەر لەسەرەتای ئەم نامیلکەیە دەڵێت:

بزانن ڕەحمەتی الله لە ئێوە و ئێمەش بێتن کەوا مەزهەبی ئەهلی حەدیث و ئەهلی سوننە و جماعە دانانن و ئیمان هێنانە بە الله وملائکته وکتبه ورسله. هەروەها قبوڵکردنی ئەوەی هاتووە لە کتابی الله و قسەی لەسەر کراوە، هەروەها دڵنیابوون لە ڕاستی و دروستی ئەوەی کەوا دەگەڕێتەوە بۆ رسول الله (ﷺ) و، مەجال و ڕێگایەک نییە بۆ ڕەفزکردنەوە یان قبوڵ نەکردن. ئەگەر ئێمە فەرمان پێکراو بین بە شوێنکەوتنی قورئان و سوننەت، هەروەها کەفالەت یان دڵنیاکراوین لەوەی هیدایەت لەوانەدایە. بۆشمان ڕوونکراوەتەوە کە رسول الله لەسەر هیدایەت و هیدایەتدراوە و بەرەو هیدایەتمان دەبات.

هەروەها لەکۆتا خاڵی نامیلکەکەی دەڵێت: واجب بوونی دەستگرتن بە کۆمەڵ و کۆمەڵی ڕزگار بوو.

تێبینی: (لێکۆڵەر، نوسەر ئەم قەولەی وەک بیروباوەڕی زۆرینەی پێشەوایانی سەلەف و خیر القرون هێناوە، ئەویش شوێنکەوتنی قورئان

و حەدیثی صەحیح، هەروەها دەستگرتن بەکۆمەڵی ڕزگاربوو کە ئەمە ئیعتیقادی زۆرینەی پێشەوایانە. هەروەها دەڵێت: بۆئەوەی ڕێگای هیدات بزانیت، دەبێت شوێن ئەم ئەمرانە بکەوی و دڵنیاش بیت لەوەی کە ئەگەر ئێمە شوێن ئەم فەرمانانە بکەوین لە فیتنە و گومڕایی پارێزراو دەبین).

ئەم بەڵگانەی کەوا لەسەرەوە بۆم دانان بریتی بوون لە ئیعتیقادی خیر القرون ئەگەر شوێنیان بکەویت پارێزراوی لە فیتنە و گومڕابوون، ئەگەر نا تیاچو و گومڕا و ڕەنجەڕۆی.

هاتنی پێغەمبەران گشتیان لەکاتێک بووە کەوا خەڵک کەوتبوونە هەڵە و تاوان و کوفر و شیرک، بۆنمونە کاتێک نوح علیه سلام هات گەلەکەی تۆشی شیرک بووبوون و بت و داریان دەپەرست. هەروەها کاتێک هود علیه سلام و صالح علیه سلام و شعیب علیه سلام و لوط علیه سلام نێردران بۆ نێو گەلەکانیان، لەکاتێکدا بوو کەوا توشی فیتنە و کوفر و شیرک و تاوان بووبوون. بۆچی ئەوان نێردران؟ هەتا بۆیان ڕوونبکەنەوە و، بەهەمان شێوە ئیبراهیم علیه سلام کاتێک چوو یان نێردرا بۆ گەلەکەی ئەوان توشی کوفر و شیرک بووبوون. مانگ و ئەستێرە و خۆر و بتی دەستکردیان دەپەرست و، موسا علیه سلام کاتێک نێردرا کەوا خەڵک کەسێکیان کردبووە خوا. ئەم کەسەش خۆی کردبووە خوا و دەیگرت و

دەیکوشت و ستەمی دەکرد و بوو بووە تاغوت "فیرعەون". بەهەمان شێوەش پێغەمبەر ئاخیر زەمان (ﷺ) خەڵک توشی شیرک بووبوو. ئەوان خوایان دەپەرست و دەیانناسی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هاوبەشیان بۆ بڕیار دەدا. لەکۆتاییدا هەر پێغەمبەرەو بەجۆر و شێوە و ڕێبازی جیاواز و شەرعی جیاواز نێردران بۆ نێو گەلانیان، بەڵام هەر هەموو پێغەمبەران کۆک بوون لەسەر (لا اله الا الله، کما قَالَ الله تَعَالَىٰ:﴿وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَ﴾.

ئەوەی گرنگە ئەوەیە هەتا ئەوکاتەی خەڵک توشی کوفر و تاوان و گوناهـ نەبوون نەنێردران. وەکو أبو سعید الدارمی لە کتابی الرد علی الجهمیەدا دەڵێت: وا گومانمان نەدەبرد پێویست بکات، کاتێک یەکێک موسڵمان بێت و ئیمان بهێنێت، ئێمە بەڵگەی ئەوەی بۆ بهێنینەوە کەوا عەرش بسەلمێنێت و بڕواکردن پێی. تاوەکو ئەوکاتەی الله تعالی تاقیکردینەوە بەم کۆمەڵە مولحیدە کەوا قسەیان لەسەر ئەم باسەکرد.

مەبەستی نوسەر لە جعد و جهم و هاوبیرانیانە. ئەگەر ئەوان نەهاتبایەن و ئینکاری عەرش و زۆر سیفەتی تری اللهیان نەکردبا، ئەوا پێویست نەبوو بۆ هیچ یەکێک لەوانەی موسڵمان دەبن بەڵگە بهێنینەوە کەوا الله لەسەر عەرشە، چونکە شتەکە ڕوونە و ئایەتی صەریحی لەسەرە. بەڵام بەهۆی ئەوەی خەڵک و موسڵمانی ساویلکە گومڕا نەبن.

هەر هەمان زانا واتە أبو سعید الدارمی، لەکتابێکی تر بەناوی (الرد علی بشر المریسی)دا دەڵێت: شبهە و بەڵگەکانی "بشر هین" ئەوەنین کە تەنانەت وەڵامیش بدرێنەوە، بەڵام بۆئەوەی موسڵمانی نەزان و بێ عیلم توش نەبێت و گومڕا نەبێت).

کەواتە ئێمەش بەهەمان شێوە بەهۆی ئەوەی سەردەم سەردەمی گومڕابوون و فیتنە و کوفر و شیرکە، ئەگەر موسڵمان یەک تۆز شارەزابێت لەدین دەزانێت چی جۆرە بانگخوازێک حەقە و کێش گومڕاکەرە. بەڵام بەهۆی ئەوەی ئێستا لەسەردەمی جەهل و نەزانین، موسڵمان زۆر بێ ئاگایە. بۆیە پێویستە ئێمەش وەک چۆن سەلەف و خیر القرون کاتێک بیدعە و خورافیات تەشەنەی کرد و شوبهە و گومڕاکردن گەیشتە لوتکە، هەر زانایەو لەئاست خۆیەوە دەستی کرد بە نوسین و وەڵامدانەوەی ئەهلی بیدع و گومڕاکاران، وەک ئیمامی ئەحمد کتابی نوسی بەناوی (الرد علی الجهمیة)ی نوسی و وەڵامی گومڕاکارانی دایەوە و اصول السنة)ــی نوسی. بەهەمان شێوە کوڕەکەی عبدالله بن أحمد کتابی نوسی بەناوی (السنة). هەروەها زانای بەڕێز (ئەبو سعید عثمان بن سعید الدارمی) دوو کتابی زۆر گرنگ و پێویستی نوسی بەناوی الرد علی الجهمیەوە، وەڵامی بشر المریسی. هەروەها ئیمامی بخاری کتابی نوسی بەناوی الرد علی الجهمیە. لەدوای ئەوانیش زاناکان چەندین نامیلکە و ئیعتیقادیان دەرکرد و نوسی هەر لە ئیمام ئەحمەد و

مزنی و ئەبو حاتم الرازی و ئەبو زرعە الرازی و الحمیدی و أبوبكر الإسماعیلی و بربهاری و، هەروەها لەدوای ئەوانیش قوتابیەکانیان کتابی گەورەتریان نوسی، وەک أبو بكر الخلال بەناوی السنەوە ابن بطة العكبری، کەوا دوو کتابی نوسی بەناوی إبانة الصغری، والكبری. ئنجا ئەبو القاسم ألكائی کتابێکی زۆر گرنگی نوسی بەناوی (شرح اصول اعتقاد أهل السنة) ئەم کتابانە بۆچی؟

لەوەڵامدا دەڵێم ئەم کتابانە کتابی عەقیدەیی بوون و ئصولی دین بوون. ئەم زانا بەڕێزانە هەستاون بەسەنەدی تەواو، قسەی خۆیان نا، بەڵکو ئەثەری سەلەفی خۆیان لە تابعی و ئەتباعیان نەقڵ کردووە. هەر لە ئیمان هێنان هەتا مەسائیلە لاوەکییەکانی تریش. واتە بیروباوەڕی ڕاستەقینەی خیر القرونیان تێدا نەقڵ کردووە، بۆئەوەی خەڵک بزانێت و توش نەبێت و بۆئەوەی گومڕا نەبن. واتا کاتێک گومڕاکەران و دڵ نەخۆش و مونافیق و زەندیقەکان شوبهە و گومانێکیان دروست کردبایە، وەک ئەوەی دەڵێن الله لەسەر عەرش نییە. ئەوان هاتوون بەبەڵگەی چەندان ئایەت و ئەقوالی سەلەف وەڵامی گومانەکانیان داونەتەوە. یان کاتێک هاتوون گومانی ئەوەیان دروست کردووە لەسەر قەدەر وەک "غیلان" و هاوبیرانی بەوەی نەفی قەدەریان دەکرد، واتە نەفی ئەوەیان دەکرد کەوا الله عیلمی بەهەموو شتێک هەبووبێتن. یان دەیانگووت: شەڕ بەدەستی ئەو نییە. بۆیە پێشەوایانی سەلەف ڕەحمەتیان لێبێت، هاتوون

وەڵامیان داونەتەوە. بۆنمونە لەسەرجەم ئصول و ناملیکه عەقیدەییەکانیان دانیان بەوە ناوە کەوا قەدەر خێر و شەڕ لەژێر دەسەڵاتی الله تعالی دایە. هەروەها هاتوون ئیستتابەیان بەوانە کردووە کەوا قسەیان لەسەر قەدەر دەکرد و تەکفیریان دەکردن و تەبەڕایان لێدەکردن. واتە پێشەوا و ئیمامە بەڕێزەکانی خیر القرون خاڵ بەخاڵ وەڵامی گومانی گومڕاکەرانیان داوەتەوە (ولایخافون لومة لائم). تەنانەت زۆرێکیان باجیان بەژیانی خۆیان داوە. لەمحنەتی خەلقی قورئان دەیان زانا توشی ئەم تاقیکردنەوە گەورە بوون، بەڵام ئەوان کۆڵیان نەدا و تەنازولیان نەکرد. تەنانەت تەکفیری هەموو ئەوانەشیان دەکرد کە بڵێن قورئان مەخلوقە (ولاكرامة). هەروەها لە ئیعتقادەکانیان خاڵێکی تایبەتیان داناوە بۆ ئەم باسە، بێ ترس و تەنازول. بەڵێ، ئەوان وەک شێر مەیدانیان بۆ هیچ گومڕاکارێک چۆڵ نەکرد، بۆیە هەتا ئێستاش ناویان ماوە.

## دەرئەنجام و کۆتایی:

چۆن پێشەکی بۆ کتێب و باس گرنگە بەهەمان شێوە دەرئەنجام و کۆتایش گرنگی خۆیی هەیە چونکە بەهۆی خاتمەوە خوێنەر زۆرینەی مەبەستی نێو باسەکەی بەدەست دەگات. سوپاس و ستایشی بێ پایانمان بۆ الله عز وجل کەوا توانیمان بەپێی بەڵگەکان لە عیلمەکانی قورئان و حەدیث و زانستی نیشانەکان و بیروباوەڕی خیرالقرون واتە

(اعتقادی سلف)، ڕێگایەک بۆ ئەهلی ئیمان دەست نیشان بکەین کەوا بزانن لە چی کات و سات و سەردەم و زەمانێکەدان، تاوەکو بتوانن خۆیان لێ وون نەبێت و، ڕێگای ڕاست واتە صراط المستقیم لەنێو سەدان ڕێگای چەوت بدۆزننەوە. کاتێک الله تعالی دەفەرمووێت: دەست بگرن بە حبل المتین واتە ڕێگای ڕاست کە لە ئاسمان بۆ زەوییە کە پێکدێت لە قورئان و سوننەت. هەروەها دوای ئەوەی زانیمان بەپێی ئەحادیث و فتن و ملاحم، کەوا ئێمە لە چی قۆناغێکی سەخت و دژواردایین کە پێکدێت لە نەمانی زانستی شەرعی. نەمانی زاناکان، دابەزینی جەهل و نەزانی، پەیدابوونی زانا و پێشەوای گومڕاکار و لەسەرووی هەموویانەوە ئێمە دڵنیا نین و ناتوانین تەنها بۆ یەک ڕۆژیش کەفالەتی ئیمانی خۆمان بکەین، لەبەیانی تا ئێوارە. ئەویش بەهۆی بوونی فیتنە کە رسول الله دەفەرمووێت: وەک شەوی تاریکە، پیاو تائێوارە بەئیمانداری نامێنێتەوە. ئەمە بەپێی زانستی نیشانەکان. هەروەها بەپێی زانستەکانی فەرموودەش لەنێویان جەرح و تەعدیل ئەوەمان باس کرد کەوا (علم یان زانست) دینە. (کما قال سلف الأمة) واتە هەروەک چۆن پێشەوایانی ئوممەت بۆیان دووپاتکردووینەتەوە. بۆیە نابێت و ناکرێت عیلم لەهەموو کەس وەربگرین، هەتا نەزانین عەقیدەی چۆنە و جێگایی متمانەبێت و درۆزن نەبێت، کەسێکی دیاربێت و مەجهول نەبێت. چونکە وەک لە فەرموودەکانی موقەدیمەی صەحیحی موسلیم چوار

فەرموودەمان هێنا، لەسەر ترسناکی و مەترسی ئەم سەردەمە. تەنانەت خودی شەیطان دێت و لەسەر شێوەی مرۆڤ باسێکی دینی بۆ خەڵک دەکات و دەڕوات. دواتر دەڵێن گوێمان لە یەکێک بوو شێوەی دەناسین، بەڵام ناوی نازانین. یان کۆمەڵە دەجالێک دێن و هەندێک شت لەدین باسدەکەن نە ئێمە نە باوباپیرانمان هەر نەشمان بیستووە. کەواتە سەردەم سەردەمێکی زۆر سەخت و دژوارە، هەتاوەکو کەسەکە نەناسین و شارەزایی نەبین و دڵنیا نەبین لە عەقیدەی نابێت عیلمی لێوەربگرین.

هەروەها بۆ دەوڵەمەندکردنی ئەم باسە گرنگە هەستام و چەندان و بەدەیان بەڵگەی (خیرالقرون) واتە پێشینە چاکەکانم هێنا، وەک هاوەڵان و تابعین کەوا بەهەموو جۆرێک ڕێگریمان لێدەکەن لە گوێگرتن و دانیشتن و تێکەڵبوون لەگەڵ ئەهلی بیدع. هەروەها تیشکم خستە سەر نامیلکە و کتێبە عەقیدەییەکانی سەلەف لە حەنبەلی و مالکی و شافعی، واتە من تەنانەت بە بەڵگەکانی مەزهەبەکانیش ڕێگای ڕزگاربوونمان دەستنیشان کرد. کەواتە بپرسە لەو ئەهلی عیلمەی کەوا خۆت متمانەت پێی هەیە وەک ئەم نمونانە: لە فەرموودەی (متفق علیه) واتە بوخاری و موسلیم هاتووە لە حذیفة بن الیمان (رضي الله عنه)، دەفەرمووێت: خەڵک پرسیاری خێریان لە رسول الله (ﷺ) دەکرد. منیش پرسیاری (شەڕ)م دەکرد. دواتر دەفەرمووێت: بۆیە پرسیاری شەڕ، واتە پرسیاری فیتنەم لێدەکرد، بۆئەوەی نەکەومە ناویەوە. سەیربکەن تیشک بخەنە سەر ئەوەی

پرسیاری کرد، بۆئەوەی بزانێت، بۆ؟ چونکە ئەگەر زانی، ئەوە چاکتر حەقی بۆ دەردەچێت.

هەروەها ئیمامی ئەبوداود لە سونەنەکەی هێناویەتی بە مەرفوعی و سەنەدی صەحیح، کاتێک کۆمەڵێک هاوەڵ لەسەردەمی پێغەمبەر دەرەچن بۆ (سەفەر یان غزا) لەشەوێکی زۆر سارد. یەکێکیان توشی لەشگرانی دەبێت، واتە غوسلی دەکەوێتە سەر. بۆیە پرسیار لەهاوەڵان دەکات چی لەسەرە. ئەوانیش دەڵێن: دەبێت خۆت بشۆیت. ئەویش پێیان دەڵێت: ساردە و هیچ ڕێگای تر نییە. ئەوانیش دەڵێن: نەخێر، هەر دەبێت خۆت بشۆیت. بۆیە خۆی دەشوات و بەو شەوە لەسەرما ڕەق دەبێتەوە و دەمرێت. کاتێک دێنەوە لای رسول الله و هەواڵەکەی پێدەڵێن. پێغەمبەر زۆر تورە دەبێت و دەفەرمووێت: کوشتان، خوا بتان کوژێت. ئایا نازانن چارەسەری نەزانی پرسیارکردنە.

کەواتە جەهل و نەزانی نەخۆشییە، واتە دەردە و چارەسەرەکەی بەپێی حەدیث پرسیارکردنە لە ئەهلی خۆی. وەک لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە (لكل داء دواء)، واتە بۆ هەموو نەخۆشییەک دەرمانێک یان چارەسەرێک هەیە. بۆیە پێویستە بپرسن و فێربن، تاوەکو بزانن و ڕزگارتان بێت.

**داواکارم لە الله بمانخاتە سەر ڕاستە ڕێگا.**

پێشەکی---------------------------------------------------------------------------------------٢
بەشی یەکەم: ڕێگای ڕزگاربوونت -------------------------------------------------------٥
بەشی دووەم: دروستبوونی ئیختلاف ---------------------------------------------------٨
بەشی سێیەم: ئێمە لەچی سەردەمێکداین بەپێی زانستی نیشانەکانی قیامەت؟ ---------- ١١
یەکەم: بەپێی زانستی نیشانەکان ئێمە لەسەردەمی بۆ عیلمین. ---------------------- ١٢
دووەم: نەمانی زاناکان. ------------------------------------------------------- ١٣
سێیەم: زانا و پێشەوای گومڕاکار. --------------------------------------------------- ١٥
چوارەم: لە دەستدانی ئیمان.---------------------------------------------------- ١٧
بەشی چوارەم: ڕزگاربوون لە فیتنە بەپێی (علمی حديث) زانستی فەرمودە. -------------- ١٨
یەکەم: لە عیلمی جرح و تعدیل تەنیا کەسانی ثقە.------------------------------------ ١٨
دووەم: نابێت دین لەهەموو کەس وەربگیردرێت. ------------------------------------ ١٩
سێیەم: علمی مصطلح الحديث زانستی زاراوەکانی فەرموودە ----------------------- ٢٢
بەشی پێنجەم: دورکەوتنەوە لەپێناو پاراستنی ئیمان. ------------------------------------ ٢٧
یەکەم: کەسانی متشابهـ دروستکەر.--------------------------------------------- ٢٨
دووەم: بیدعە و کەسانی موبتەدیع. --------------------------------------------- ٢٨
بەشی شەشەم: ڕزگاربوون لە فیتنەکان بەپێی ئیعتیقادی سەلەف و خیرالقرون. ---------- ٣٣
یەکەم لە اصول السنة إبن أبی زمنين:----------------------------------------------- ٣٣
دووەم: أصول السنة لإمام أهل السنة أحمد بن حنبل (رحمه الله). -------------------- ٣٦
سێیەم: لە شرح السنەی البربهاری:------------------------------------------------ ٣٧
چوارەم: اعتقاد أئمة الحديث - أبو بكر الإسماعيلي. ---------------------------------- ٣٨
دەرئەنجام و کۆتایی: ------------------------------------------------------------ ٤٣